


# عەقیدە وبنیاتنان لە پێش بنیاتنانی هەموو شتێکی ترەوەیە

نوسینی
م. عەلی هەولێری فێرگە



## عەقیدە وبنیاتنان لە پێش بنیاتنانی هەموو شتێكی ترەوەیە

ئێمەی ئیمانداران دەبێت ئەوە بزانین كە عەقیدە و بنیاتنان وپۆلێن كردنی مرۆڤەكان لە پێش بنیاتنانی هەموو شتێكی ترەوەیە،بە گشتی بناغەی ئیسلامەتی و ناوەڕۆك و چەقی ئیسلام بریتی یە لە عەقیدە،چونكە عەقیدە لە ئیسلامدا وەك بناغەی خانوو وایە تاوەكو بناغە پتەو تر بێت بیناو دیواری بەرزتری لەسەر دەكرێت و مەحكەم دەبێت و نارووخێ ، ئەمەش ئەو ڕاستییەیە كە پێویستە هەمووان بیزانن و كاری بۆ بكەن وبیكەنە بەرنامەی كارتان لە هەموو قۆناغ و لە گشت بوارەكاندا. ئەگەر وانەبووین لەبنیاتنانی خۆمان ئەوە دڵنیابن سەلامەت نابین هەر ئاوا ئاسان دوژمنان و ناحەزان زاڵ دەبن بەسەرمان ! مێژوو شاهێدە ئەو كاتەی كە چینیە كۆنەكان ویستیان بێ كێشەو بە ئارامی بژین و پارێزگاری لە خاك و وڵاتیان بكەن، بڕیاریان دا كە دیوارێكی بەرز و سەخت دروست بكەن، كە بە دیواری مەزنی چین ناسراوە، بۆ ئەوەی ببێتە بەربەست و لەمپەر لە بەردەم دوژمنان و ڕێگر لە هاتنە ناوەوەی داگیركەران. كەچی لە ماوەی سەد ساڵی دوای بنیاتنانی ئەم دیوارە مەزنە سێ جار تووشی ڕووبەڕوو بونەوەی هێرشی دوژمن و داگیركەران بوون و لە هیچ لەم هێرشانەدا ئەو هێزانە پێویستیان بە هەڵتەكان وڕووخان و كونكردن یان پیاهەڵگژانی دیوارە مەزنەكە نەبوو، بەڵكو هەموو جارێ لە دەرگاكانەوە و بە شێوەیەكی ئاسایی دەهاتنە ژوورەوە! دەزانن بۆ چی؟ چونكە نەیان توانی بیروباوەڕێكی چاك تۆكمە خەڵكەكەی خۆیان و پاسەوانی قەڵاكە بنیات بنێت وەكو شوراكە ، بۆیە هەر هێزێكی داگیركار كە دەهات برە پارەیەكی 'بەرتیل' دەدا بە دەرگاوان وپاسەوانی دەرگاكە و بە ئاسانی دەچوونە ژوورەوە بێ هێزو خۆماندووكردن ! چینیەكان زۆر ماندووبوون لە بنیاتنانی ئەو دیوارە مەزنە كەچی شتێكی گرنگتریان لە بیر كردبوو كە ئەویش بنیاتنانی پاسەوانەكان بوو ! یەكێك لە ڕۆژ هەڵات ناسان دەڵێت: (بۆ ئەوەی هەر شارستانیەتێك كۆنترۆڵ بكەیت و بڕوخێنێت، ئەو هۆكارانەی هەیە بۆ گەیشتن بەو مەبەستە؛ڕووخاندنی خێزان.بانگەواز بۆ ڕووت كردنەوەی ئافرەتان لەپێناو داڕوخانی خێزان و دارمانی ڕەوشت وئەخلاق[ الإباحیە] واتە: دەرچوون لە ڕەوشت و ئەخلاق و ئاداب، یاخود بیرۆكەیەكە كە بانگەشە دەكات بۆ پابەند نەبوون بە ڕێسا و یاساكانی داب ونەریتە جوانەكانی كۆمەڵگە لە

ژیاندا، یان ئازاد بوون لەو کۆت و بەندانەی کە چاودێری تاکی پێ دەکرێت، و هانی تاك دەدات بۆ ڕۆچوون لە خراپە و تاوان و سەرپێچی بەبێ ترس و دڵەڕاوکێ)

لەیەکێك لە نوسخەی سەرەکی سەردێرە نووسینەکانی صەهیۆنیەکاندا ئەم باسە هاتووە کە دەڵێت: [ پێویستە کار بۆ داڕمانی ئاکار و ڕەوشت بکەین لە هەموو شوێن و جێگەیەکدا، بەو شێوەیە هەزموون و زاڵ بوونمان مسۆگەر دەبێت. ئەوەتا [فرۆید] لە ئێمەیە و بەردەوام پەیوەندیە سێکسیەکان پەرە پێدەدات لەژێر ڕۆشنایی خۆردا، بۆ ئەوەی لە تێڕوانینی گەنجاندا شتێك نەمێنێتەوە بەناوی پیرۆز، و هەموو خەم و ئومێدێکی ببێتە تێرکردنی غەریزە ی جنس و حەز و ئارەزووە سێکسیەکانی، و ئیتر بەو هۆیەوە ڕەوشت و ئاکاری دادەڕوخێت ].

ئەوەش کە بەداخەوە زیاتر دەبێتە هۆی مەترسیدارترکردنی ئەم کۆسپە و گرفت دروست کردن، ئەوەیە کە چەندین بەکرێ گیراوی ئەو دوژمنانە بوونیان هەیە لەنێو ڕیزەکانی موسڵماناندا، و بەزمانی ئێمە قسە دەکەن، و جل وبەرگی ئێمەی موسڵمانیش دەپۆشن، لەپێناو بەلاڕێدا بردنی ڕۆڵەو نەوەکانمان بە فکروبیری بێباوەڕی دوژمنان و بانگەوازە نارەواکەیان.ڕووخاندنی پرۆسەی خوێندن.ناشرینکردن و لەکەدارکردنی کەسە سەرمەشق و جێ متمانەکان.

**ئەوەی ئێستا ناحەزانی ئیسلام بەهاوکاری مورتەدو بە کرێگیراوان گرنگی پێ ئەدەن ئەم خاڵانەیە:-**

**یەکەم**: دژایەتی ولەناوبردنی قورئانی پیرۆزە لەبەر ئەوەی دەزانن قورئان سەرچاوەی دەسەڵات و شکۆمەندیمانە. دەزانن قوڕئان ووتەو فەرمایشتی الله تعالی یە.سەرچاوە و یەکلاکەرەوەی چارەسەری هەموو بوارەکانە لە کۆمەڵایەتی و ئابووری و عەسکەری و سیاسی و زانستیدا. نووسەرێکی خاچ پەرەست بەناوی [کاتلی] لەنووسینێکی دەڵێت: [ پێوستە قورئان لە دژی خودی ئیسلام بەکاربهێنین هەتا ئەو کاتەی بەتەواوەتی لەناوی دەبەین، وە دەبێت ئەوە بگەیەنین بە موسڵمانان کە ئەوەی صحیحە لە قورئان تازە نیە و ئەوەش تازەیە ئەوا صحیح نیە ].

**دووەم** : تێکدان و شێواندنی مێژوو هزرو بیری ئیسلامی،بۆ دابڕینی موسڵمان لە مێژووە شکۆدارەکەی و ڕابردووە پرشنگدارەکەی و لەپێناو گوماناوی کردنی تاکی موسڵمان بۆ ئینتیمای و سڕینەوەی ناسنامەی و شێواندنی بیروباوەڕی. هەربۆیە بۆ گەیشتن بۆ ئەو مەبەستە پەنایان بردۆتە بەر زیندوو کردنەوەی چەندین باوەڕی هەڵەو ڕووخێنەر کە پەڕەی پرشنگداری مێژو و هزری ئیسلامی ئاوەژوو دەکاتەوەو چەواشەی موسڵمان دەکات. جا لەو بیروباوەڕە مەترسیدارانە کە برەویان پێ دراوە وەك:

**ا-** [زیندووکردنەوەی بیری بتپەرستی و ئیلحادی. زیندووکردنەوەی هزری فەلسەفی و باوەڕی -وحدة الوجود و حلول- و.. لەپاڵ بانگەواز بۆ توحید الله بەیەك دانان].

**ب-** [زیندووکردنەوەی بیری نەتەوەپەرستی ودەمارگیری، و نوێکردنەوەی تەفسیری قورئان لە ڕۆشنایی ئەوەداو ناکۆکی نێوان موسڵمانان و قەرامیتە و مەزهەبگەرایی. زیندووکردنەوەی بیری موعتەزیلە و خەواریج و شیعەو مورجیئەو موعتەزیلەو پاشان جەبری و قەدەریەکان و هتد.. زیندووکردنەوەی بیری ئەم گرووپە لادەر و گومڕایانە کەلە ئیسلام دەرچوونە وتێکدانی ڕیزی موسڵمانان وبڵاوکردنەوەی ڕۆحی لەیەکدوورکەوتنەوە ململانێ و سیراع و نیزاع و یەکتر تەکفیر کردن ،وەهەروەها زیندووکردنەوەی ڕەگەزپەرستی سەردەمی نەفامی نەوەك لەنێوان گەلانی موسڵماندا بەڵکو لەنێو ڕۆڵەکانی یەك نەتەوەشدا، بۆ ئەوەی هەمیشە پەرتەوازە ببن و یەکگرتوو یەکدەست نەبن و لەبری ئەوە ببن بەچەندین حزب و لایەن و زیندووکردنەوەی بیری حزبایەتی ولەت لەت کردن و پارچەپارچەکردنی ڕۆڵ و کاریگەریان نەمێنێت، ئەوەش ئەمڕۆ دەبینین و لەپێش چاومانەوەیە باشترین شاهێدە لەسەر ئەو ڕاستیە.

لێرەدا دەبێت دان بەو ڕاستیەدا بنێین – بەداخەوە- دوژمنان لەم هەنگاوەیاندا سەرکەوتوو بوون لە دارمان و هەڵتەکاندنی خیلافەتی ئیسلامی، و جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت ئەوەش لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدە و لەسەر دەستی بەکرێگیراوی ناپاك لەدینی و ئوممەتی – کەمال ئەتاتورکی کافرو مورتەد – و لە پەیماننامەی لۆزاندا کە لەساڵی 1923 ئەنجام درا. ئەمڕۆش ئەبینین لەدوای ئەوەی کەچارێکی تر خیلافەتەکە گەڕایەوە دووژمنانی

ئیسلام دیسان لەرێگای بەکرێگیراوانی بەناو زانایی دین فرۆش و مورتەدانی کوردو عەرەب و توورکەوە کەوتوونەتەوە دژایەتیەکی زۆر زۆر توووند بەهەموو جۆرە چەك و هێزێکەوە بۆ دارووومانی،بە هاوکاری ئەم بەکرێگیراوانە نەبوایە نەیان ئەتوانی ئەم چەند شارو ناوچەیەش بگرنەوە دڵنیابن ،ئەوەش مانایی لەناوچوون نیە بەپشتیوانی الله تعالی ئەمجارە ناتوانن کۆتایی پێ بهێنن و بن بڕی بکەن ،چونکە بەفەزڵ و منەتی الله تعالی رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبین .خۆمان ونەوەکانمان لەسەر عەقیدەی تەوحید . عەقیدەی پاکو روون بنیان ئەنێین..بۆدەبینەوە خاوەنی ئەم موژدەیەیە ئەمەش موژدەی الله تعالی یە: (وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ)ئە م 'بەکرێگیراو' دووڕووانە نازانن کە؛ عیززەت و دەسەڵات و پایەداری هەر شایستەی الله و پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانە.

8[1]رەبیعی دووهەمی 1440 کۆچی بەرامبەر بە 2018/12/15 زاینی

**(التوحید) تەنها (الله)پەرەستی دوور کەوتنەوە و بێ باوەڕبوون لە هەموو طاغوت و پەرستراوێکی تر**

زۆرینەی خەڵکی ئەم سەردەمە لە گومڕایدا ڕۆچووە و تیاچووەو سەری لێ شێواوە، بە هۆیەوە خۆیان شایستەی نەفرەت وسزاو تۆڵەی الله تعالی کردووە ، ئەوەش تەنها لەبەر ئەوەی کە ناوەڕۆکی (التوحید) و تەنها الله پەرستیان بەجێ نەهێناوەو بە گوێرەی پێویست مافی خۆی نەداوەتێ و تەنها الله تعالی بەتاك وتەنهایی ناناسن، چونکە الله تعالی تاك وتەنهایە بەشێوەیەك کەبەندە تەوەکول و پشت بەکەس نابەستێت ئەونەبێت، ئومێدی گەیشتنی نیە تەنها بە دیداری پیرۆزی ئەونەبێت، لە کەس ناترسێت تەنها ئەونەبێت، تەنها بە ناوی ئەوەوە سوێند دەخوات، تەنها لە پێناوی ئەو گیان ئەبەخشێ و پشت لەکەسو کارو ماڵ و دنیا دەکات، نەزرو سەربڕینی تەنها بۆئەوە، تۆبەو پەشیمانی دەرنابڕێت تەنها لە پێشگای بەسۆزی ئەونەبێت و لەبەر ئەو نەبێت ، ئائەمەیە بەجێ هێنانی کرۆکی(التوحید) وتەنها الله پەرستی نەبێت .(التوحید) تەنها الله پەرەستی ئەو ئامانج ومەبەستەیە کە الله تعالی تەواوی پێغەمبەرانی (علیهم السلام) ی بۆ ڕەوانە کردووە ئەوەی گومانیشی هەیە ئەوەتا الله تعالی لە قورئانە پیرۆزەکەی خۆی دا فەرمانمان پێ دەکات و دەفەرموێت: ( وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ۖ) (النحل؛36)

واتە: بەتەئکید ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت:

**یەکەم**: (التوحید) تەنها الله بپەرستن

**دووەم** : خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر وەتاغوتیش هەرکەس و شتێکە کە جگە لە الله تعالی بپەرسترێت لە [شەخص و بت ودارو گۆڕ وبەرد.....] مەرج نیە کەسێك کرنوش بەرێ بۆ دروست کراوێك ئەمجا بڵێین کافرو بێ باوەڕ بووە ؟ تەنها هاوار بکرێتە یەکێکی تر جگە لە (الله)؛ ئەوە پەرستن و عیبادەت بۆ ئەو کەسە کراوەو کراوەتە شەریك بۆ (الله تعالی) یان هەر ترسانێکی نهێنی بە ئیعتیقادەوە لەغەیری الله تعالی ترسانێك کە لە بیروباوەڕ و ئیعتیقادی دڵەوە دروست بووبێ لە یەکێك کە زۆر خاوەن دەسەڵاتە ئیعتیقادی ئەوەی پێ ببرێت کە توانای زاڵ بوون و هێنانی خێر و لادانی شەڕی هەیە جا لەبەر ئەوە مرۆڤ لێی

بترسێت و زەلیل و ملکەچی بێت ئەوەش کوفرو شریك بڕیاڕدانە بۆ (الله تعالى) پەنا دەگرین بە (الله تعالى) زۆرێك زۆر هەڵە حاڵین لەو باسە !! الله تعالى بۆمانی ڕوون کردۆتەوە کە ئەوەی هاوار دەکاتە غەیری(الله) گـومـڕاترین کەسـەو کەس لەو گومڕاتر نی یە، چونکە ئەوانەش کە هاواریان دەکرێتێ عەبدو بەندەو لێ یان دەترسن یان زۆر خۆشیان دەوێن دروستکراون وەک خۆیانن لەدروستکراوێتیدا .

الله تعالى دەفەرمووێت: (وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ ۚ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ) (المومنون؛117).

واتە: هەرکەسێك لەگەڵ خوا هاواربکاتە پەرستراوێکی تر؛ کەهیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە لەسەر ئەم هاوارکردنە، ئەوا ئەو کەسەی کە لەگەڵ (الله) هاواری کردە کەسانی تریش حیسابەکەی لای (الله) یە و خۆی موحاسەبەی دەکات، وە حیسابەکەیشی ئەوەیە کە سەرفراز نابێت چونکە کافرە. وە کە ڕزگار و سەرفرازیش نەبوو ئەوا بە هیلاك چووە و جێگای دۆزەخە بە بەردەوامی .

پێشەوا الشنقيطي ‘رحمه الله’ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ((قد بين أن حسابه الذي عند ربه، لافلاح له فيه بقوله بعد(انه لايفلح الكافرون) وأعظم الكافرين كفرا هو من يدعو مع الله إلها آخر... ونفي الفلاح عنه يدل على هلاكه وأنه من أهل النار، وقد حذرنا الله من دعاء إلهٍ معه في آيات كثيرة...))[أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن]

کەواتە : هاوار کردنە غەیری (الله تعالى) کوفرەو گەورەترینی کافران ئەو کەسەیە هاوار دەکاتە غەیری (الله تعالى) لەگەڵ (الله). بەڵام بەداخەوە زۆر لە خەڵکی بە نەزانی هاوار دەکەن و دەڵێن؛ (يا محمد، یا غەوس یا شیخ و فلان و فیسار) هاوار !. دەڵێن ئێمە هاواری ئەوان دەکەین کە الله بەواستەی ئەوان وەڵامان بداتەوە کە ئەمەش کوفرە پەنا بە الله تعالى دەگرین .

بۆیە ؛تەنها الله پەرستی و تەنها الله ناسی کارو ئاواتی هەرەگرنگی هەموو پێغەمبەران بووە وەکو الله تعالى دەفەرموێت: (وَاسْأَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَا أَجَعَلْنَا مِن دُونِ الرَّحْمَٰنِ آلِهَةً يُعْبَدُونَ)( الزخرف؛ 45)

واتە: ‘ئەی محمد( صلى الله وعليه وعلى اله وسلم)’ تۆ لەو پێغەمبەرانەی کە ناردوومانە لەپێش خۆشت بپرسە، ئایا جگە لە(الله) هیچ خوای ترمان دیاری کردووە کە بەندایەتی بۆ بکرێت.

واتە: هەموو پێغەمبەران بۆ یەك مەبەست هاتوون هەموو یەك دەنگن بۆ (التوحيد) تەنها الله پەرستی و دوور گرتن لە شێوازی کوفرو شیرك و بت پەرستیی، بەڵکو هەموو دورستکراوەکانی مرۆڤ و جنۆکە تەنها بۆئەوە بەدی هێنراون کەتەنها الله تعالى بە تەنهایی بپەرستن، هەروەکو الله تعالى فەرمانمان پێ دەکات دەفەرموێت: ( وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ) (الذاريات؛56)

واتە: (الله) پەری و مرۆڤی دروست کردووە تەنها بۆ ئەوەی بیپەرستن و فەرمانبەرداری بن.

هاوەڵی ئازیز معاذی کوری جبل ‘رضى الله عنه’ دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: (کاتێك بەرێدا دەرۆیشتم لەدوای پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) لەپڕدا پێغەمبەری الله رووی تێکردم و لێی پرسیم: ئەی معاذ؛( ئایا دەزانی مافی (الله)چیە بەسەر بەندەکانیەوە و مافی بەندەکانیش چیە بەسەر الله تعالى)؟؟

دەفەرمووێ: لەوەڵامدا گووتم؛ الله تعالى و پێغەمبەرەکەی زاناترن و دەزانن. ئەمجا پێغەمبەری ئازیزمان (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) فەرمووی: مافی الله ئەوەیە کە بەندەکان بەتاك وتەنهایی بیپەرستن و هاوبەشی بۆ رەوا نەبینن .وە مافی بەندەکانیش ئەوەیە کە هەر کەس بەو کارە هەستا بەرێك وپێکی ئەوا الله تعالى سزای نەدات...

بەرێزان خوشکان و برایانی خۆم ؛ هەموو کردوەکانی مرۆڤ دەوەستێنرێت و سەرنج دەدرێت، هەرکردەوەیەك بۆجگە لە الله تعالى بووبێت و ئەنجام درابێت ئەوا رەد دەکرێتەوە و وەرناگیرێت بەڵکو بۆ ئەو کەسەیە کەبۆی کراوە لە فەرموودەی قودسیدا هاتووە کە پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) فەرموویەتی: الله تعالى دەفەرموێت: ( ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر بەقەد فراوانی زەوی بەگوناهو تاوانەوە بگەرێیتەوە بۆ لام هیچ شتێکت نەکردبێتە هاوبەشم و شرکت بریارنەدابێت ئەوا بەقەد فراوانی زەوی بەلێخۆشبونەوە دێمبەرەو رووت).

هاوەڵی ئازیز عبداللە ی کوڕی مسعود'رضی اللە عنە' پرسیار لە پێغەمبەری اللە (صلی اللە علیە وعلی الە وسلم) دەکاو دەڵێ:( گەورەترین تاوان بەلای اللە وە چیە وکامەیە؟ پێغەمبەری ئایزیزمان (صلی اللە علیە وعلی الە وسلم) لەوەڵامیدا دەفەرموویێت: ((ئەوەیە کە هاوشێوەوهاوبەش بۆ اللە تعالی دابنێیت،لەکاتێکدائەو تۆی بەدی هێناوە)) .!!

لەبەر گەورەیی و بەپێزی ئەم باسەیە کە (التوحید) ە کە پێغەمبەران ترساون لەوەی نەمێنێت لەناوخەڵکیدا و ون بێت! ئا ئەوە باوکی موحیدان وتێك شکێنەری بت و پەیکەرەکان و بونیاد نەری کەعبەی موسڵمانان.... إبراهیم( علیە السلام) لە اللە تعالی دەپاڕایەوە کە بیپارێزێ لە شرك، جاکێ لەوە ناترسێت کە توشی بێت دوای ئیبراهیم کەنێردراوی اللە تعالی یە ؟! پێغەمبەر ئیبراهیم ( علیە السلام ) لە یەکێك لە دوعاکانیدا ، کە اللە تعالی لە قورئاندا باسی دەکات دەفەرمووێ: (وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الْأَصْنَامَ) (إبراهیم؛ 35)

واتە: وە پەروەردگارم خۆم و نەوەکانم بەدوور بگرە لە پەرستنی بتەکان. سبحان اللە ! ' پێغەمبەر ئیبراهیم 'کە پێشەوای موحیدان و شکێنەری بتەکان بووە و وازی لە باوك و گەلەکەی هێناوە لەبەر ئەوەی بتپەرست بوون، هێشتا دەترسێت لەوەی ڕۆژێك دابێت خۆی و نەوەکانی تووشی بتپەرستی ببن! هەر بۆیە زانایان فەرموویانە: (فمن یامن البلاء بعد ابراهیم)؟!

واتە: کێ هەیە بێ ترس بێت لە تووش بوون بە بەڵا لە دوای ئیبراهیم ؟!هۆکارەکانی لەدەستدانی باوەڕ و لاڕێبوون. بۆیە موسڵمان دەبێت هەمیشە مەترسی لەوە هەبێت کە ڕۆژێك دابێت باوەڕەکەی لەدەست بدات بەتایبەتیش لەم سەردەمەدا کە فیتنەو شیرك شەڕ و ئاشوب و فەساد و بەرەڵایی تێیدا زۆرو بڵاوە،کافرو موشریك و مورتەدان بە چاك و ئیماندار و بە ئاشتیخواز دادەنرێت ، ئەهلی توحید و حەق و جیهادو ڕاستگۆو داوێن پاك و دەست پاك و ئاشتیخوازیش بە تیرۆریست مەترسیدار دادەنرێت ؟؟ دووڕو دزو درۆزن و بەرەڵاو داوێن پیس بە پیاوچاك و پیاو چاکیش بە نامۆ و مەترسیدار و دواکەوتوو لە قەڵەم دەدرێت. بەڕاستی ئەگەر کەسێك مەترسی لەدەستدانی باوەڕی نەبێت ئەوە کەسێکی باوەڕ لاواز و نەزانە، و لە مەترسیەکی گەورەدایە ئەم نموونەی پێشوو ئەو نموونە بەسە دەربارەی ترسی لەدەستدانی باوەڕ لای پێغەمبەران(علیهم السلام) پێغەمبەری اللە (

صلى الله عليه و على اله وسلم ) لەژیاندیدا زۆر جار ئەم دوعایەی دەکرد: (یامقلب القلوب ثبت قلبى على دينك )

واتە: ئەی هەڵگێرەوەی دڵەکان دڵم جێگیر و چەسپاو بکە لەسەر ئاینەکەت.

دایکمان دایکی ئیمانداران عائیشە'رضى الله عنها' کە گوێی لەم دوعایە بوو پێی فەرموو: ((تخاف على نفسك؟)) واتە:ئەی پێغەمبەری الله (صلى الله عليه و على اله وسلم )لە خۆت دەترسیت'کەنێردراوی الله تعالى و پاشترین مرۆڤی سەر زەویی' ؟ پێغەمبەری ئازیزمان( صلى الله عليه و على اله وسلم) لەوەڵامیدا فەرمووی: ( يا عائيشه وما يومننى وقلوب العباد بين اضبعين من اصابع الرحمن) (صحيح) واتە: ئەی عائیشە، چ شتێك دڵنیام دەکات لە کاتێکدا کە دڵی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجەیە لە پەنجەکانی الله تعالى (چۆنی بوێت وای لێدەکات).

کە پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وعلى اله و سلم )لە خۆی ترسا بێت بەو باوەڕە تۆکمەیەوە کە هەیبووە ئەی من و تۆی باوەڕ لاواز چین کە نەترسین و بێخەم بین ! پەنا بە الله تعالى دەگرین لە بێ باوەڕی و باوەڕ لاوازی, جا با هەریەك لە ئێمە پێویستە لە خەمی گەورەی پاراستنی باوەڕەکەی بێت، خەمێك هاندەربێت بۆ کردەوەی چاکە نەك بۆ نائومێدی و ڕەشبینی. خەمێك فرمێسك لە چاوەکانمان داباریێنێ، و قورئان خوێندن و یادی الله تعالى مان بیر بخاتەوە .

دواووتەم بە ئەم دوعایەیی پێغەمبەری الله ( صلى الله عليه وعلى اله و سلم ) کۆتایی پێ دێنم کە فەرموویەتی:( ياولى الاسلام واهله مسكنى بالاسلم حتى القاك عليه )[صحيح] واتە: ئەی دۆست و پشتیوانی ئیسلام و موسڵمانان پەیوەستم بکە بە ئیسلامەوە تاکو دەگەم بە دیدارت لەسەری.

2 جماد الاول 1440 کۆچی بەرامبەر بە 2019/1/7 زاینی

## ماناو گرنگی (التوحید) چیە؟

(التوحید) بریتیە لە بە تەنها دانانی (الله تعالی) لە دروست کراوێتی و پەرستراوێتی و ناو سیفاتە کانی ، وە پە رستنی تەنها الله تعالی دوور لە شیرك و هاوبە ش دانان بۆی .

وە بەختەوەری وبەرەکەت وسەرکەوتن و ئاسایشی دونیاو سەلامەتی و سەرفرازی دوا ڕۆژ تەنها بە (التوحید) و تەنها( الله) پەرستی دابین دەبێت. بەتەنها(الله) پەرستی(التوحید) ئەوەیە کەوا الله تعالی هەر لەسەرەتاوە کە ئادەمی دروست کرد پەیمانی لە ئادەم ونەوەکانی وەرگرتووە کە بریتیە لە دان نان بەتەنهایی(الله) وەشایەتی دان لەسەر نەفسی خۆیان کە (الله) پەروەردگار وخاوەن ومەلیکیانە، وەهیچ پەرستراوێك نییە بێجگە لەو ڕاست بێت هەروەك دەفەرموێت:( وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَا ۛ أَن تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَافِلِينَ)( الاعراف:172 ) کەواتە کەس بیانوی نیە و ناتوانێت لە دونیاو ڕۆژی دوایی دا بڵێت پەروەردگار ئێمە بێ ئاگابوین وەزانیاریمان نەبووە بەوەی کە (الله) یەك و وتەنها پەروەردگارمانە وهیچ هاوەڵی نییە.

الله تعالی کە ئەم بوونەوەرەی دروست کردووەو داهێناوە، پەری و جنۆکەو ئادەمیزادی دروست کرد، وەسەر زەوی پێ ئاوەدان کردنەوە، وەمانگ وڕۆژو زەوی وئەوەی تیایدایە بەردەستی کردن بۆیان تاکو بتوانن بەبێ کەم وکوڕی تیایدا بژین، وە لەگەڵ ئەوەش فەزڵ و ڕێزی داوە بەسەر ئادەمیزاد ،کەوا نێردراوی خۆی بۆ ناردن تا تێیان بگەیەنێت وڕێنموویان بکات کەبنیاد نانی ئەوان و ئەو بوونەوەرەش بۆچی و لەبەر چی؟ وەپێغەمبەرانیش هەر لە(نوحەوە... هەتا... محمد)(علیهم الصلاة و السلام) بەخۆیان و شوێن کەوتوانیان شەو ڕۆژیان لێك دەکردەوە، وەئامادەی چەشتنی هەموو جۆرە ناخۆشی وئازارو مەینەتێك بون، هەر لەبرسێتی و سەرماو گەرما و دەربەدەری پیلانی کوشتن و بەندکردن ... هەتا دەگاتە بەخت کردنی گیان ومالیان. چونکە ئەوان وەلامی ئەم پرسیارانەیان لەلابوو، وەگرنگی ئەو مەبەستەشیان دەزانی کە لەپێناویدا دروست کرابوون ونێررابوون کە پەرستنی تاکە بەدیهێنەر وبژێودەریانە بە

تەنهایی، کاتێك کە لە قورئانی پیرۆز کە کە کەلام و ووتەی الله تعالى یە ورد ببینەوە دەبینین هەمووی هەر باسی بەتەنها ویەك (الله) پەرستنیە.

**یەکەم**: یان هەواڵ دانە دەربارەی الله تعالى ناوو سیفەتەکانی ئەمەش برتنیە لە (التوحيد الخبري) ڕاگەیاندنی یەك (الله) پەرستی.

**دووەم** : یان بانگەوازو ئاگادار کردنەوەیە بۆ (التوحيد) پەرستنی بەتەنیا(الله) و دوورکەوتنەوە لەهەر پەرستراوێکی تر جگە لەو، ئەمەش بریتیە لە (التوحيد الطلبي) جێ بە جێ کردنی و داوا کردنی بەتەنها (الله) پەرستی. یان فەرمانی داواکردنی پابەند بوونە بە گوێ ڕایەڵی (الله تعالى) ، ئەمەش لەتەواوکەری ماناکانی(التوحيد) و یەك پەرستیە. یان هەواڵە لەبارەی ڕێزگرتنی (الله تعالى) لەکەسانی موحید تەنها ویەك (الله) پەرستی لە دونیا وڕۆژی دوایدا، ئەمەش پاداشتی یەك پەرستیە. هەر لەبەر ئەوە بۆیە بە باشم زانی بە پشتیوانی الله تعالى لەچەند خاڵێکدا باسی ماناو گرنگی و داخوازی و سودەکانی ئەو (التوحيد) و یەك(الله) پەرستیە ڕوون بکەمەوە .لەم بابەتەش باسی خاڵی یەکەم دەکەم بەپشتیوانی الله تعالى لەبابەتی داهاتوودا باسی خاڵی دووهەم دەکەم.

**یەکەم**: هەروەکو لە پێشدا ئاماژەمان پێدا الله تعالى پەری و جنۆکەو ئادەمیزادی دروست کرد، وەسەر زەوی پێ ئاوەدان کردنەوەو بۆ ئەوەی بەتەنها ئەوی تیادا بپەرسترێ هەروەکو دەفەرموێت: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)(الذاريات:56)

واتە: دروستم نەکردووە جنۆکە وئادەمیزاد تەنها بۆ( پەرستنی خۆم نەبێ بەتەنها).

وەهەر وەها دەفەرموێت: ( وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ)(الأنبياء:25)

واتە: (پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە کە وەحیمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە:بێگومان هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق جگە لەمن، دەمن بەتەنها بپەرستن).

وەهەر لەبەر گرنگی (التوحيد) ە کە الله تعالى بۆ هەر میلەتێك پێغەمبەرێکی ناردووە، تاکو خۆی(الله تعالى) پێ بناسێنێ وفەرمانەکانی (الله) یان پێ ڕابگەیەنێ، چونکە ئادەمیزاد تەنها لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە (الله) دەناسێ

وئاگادار دەبێ بە فەرمانەکانی وباوەڕی پێدێنێ، هەروەك الله تعالی دەفەرمویێت: (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ ۚ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ) (النحل؛36)

واتە: لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان(صلی الله علیه وسلم) ناردووە و پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێن: (تەنها(الله) بپەرستن و خۆتان دوور بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەناو ئەو خەڵکەدا کە بیرو ژیری خۆی دەخستە کارو بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕا، پەروەردگاریش هیدایەتی دەدا، وەهەیشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکردو پشتی لەڕاستی دەکرد و بەسەریدا دەچەسپا، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویدا سەرنج بدەن، بزانن سەرەنجامی ئەو کەسانە چۆن بوو کە بڕوایان بەبەرنامەی ئێمە نەبوو).

بە سەرنچ و وورد بونەوەمان بۆ ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان زیاتر مانای ئەم ئایەتەی سەرەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ودەردەکەوێت. کەوا هەر پێغەمبەرێك(صلی الله علیه وسلم) ڕەوانەکراوە پێش هەموو شتێك بانگەوازی گەلەکەی خۆی کردووە بۆ(التوحید) پەرستنی (الله تعالی) بە تەنهایی ئەوەتا پێغەمبەرنوح (علیەالسلام) بەنەتەوەکەی خۆی دەفەرموو: (يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ)( الاعراف؛59)

واتە:ئەی هۆزو قومەکەم تەنها (الله) بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی ترتان نییە کە ڕاست بێت وشایستەی پەرستن بێت.پێغەمبەر نوح( 950 ) دانە ساڵ بانگی قەومەکەی بۆ (التوحید) تەنها (الله) پەرستی کرد بە شەوو بە ڕۆژو بە ئاشکراو بەنهێنی( قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلًا وَنَهَارًا) (نوح؛5)

واتە: دوای ئەوندە ساڵە بانگەواز نوح سکاڵای کردو گوتی: پەروەردگارا من بە شەوو بە ڕۆژ بانگی قەوم و گەلەکەمم کرد (بۆ التوحید و یەک الله ناسی و پارێزکاری.

وەهەروەها پێغەمبەرانی تر(علیهم الصلاة والسلام) هەمان بانگەوازیان کردووە ولەپێناویدا هەوڵ وکۆششیان داوە وەکو پێغەمبەر (هود، وصالح، وشوعەیب، وئیبراهیم) (علیهم الصلاة والسلام)، هەروەکو الله تعالی

دەفەرموویت: (وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ) (الأعراف: 65)

واتە: بۆ قەومی (عاد)یش (هود)ی برایانمان نارد (هەروەکو نوح) گوتی: ئەی هۆزو قەوم و گەل و عەشیرەتم هەر (الله) تەنها بپەرستن چونکە جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی ترتان نیە، ئایا ئەوە لە (الله) ناترسن؟!
وەهەروەها دەفەرموویت: (وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ) (الأعراف: 73)

واتە: بۆ قەومی (ثمود)یش (صالّح)ی برایانمان نارد (ئەویش پێی گوتن): ئەی گەلەکەم تەنها (الله) بپەرستن چونکە جگە لەو خوایەکی ترتان نیە،
وەهەورەها دەفەرموێ: (وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ)(الاعراف؛85)

واتە: بۆ گەل و هۆزی مەدیەنیش (شعیب)ی برایانمان نارد، ئەویش پێی گوتن: ئەی قەوم و هۆزو گەلم تەنها (الله) بپەرستن، چونکە جگە لە (الله) هیچ خوایەکی ترتان نیە.

وەهەروەها پێغەمبەرمان محمد(صلى الله عليه وعلى اله وسلم) (13) ساڵ لە مەککەو دواتریش لە مەدینە هەر خەریکی بانگەوازی (التوحيد) بوو ئەوجا شان بەشانی (التوحيد) ئایەت هاتە خوارەوە کە ڕۆژوو بگیرێت و حەج بکرێت و جیهاد بکرێت ودەستی دز ببردرێت... کەواتە بنچینەی دینی هەموویان پێغەمبەران( عليهم الصلاة والسلام) یەکە ئەویش (التوحيد) بەتەنها(الله) پەرستنیە، پێغەمبەری الله (صلى الله عليه وعلى اله وسلم) فەرموویەتی: (لأنبياء إخوة من علأت، أمهاتهم شتى، ودينهم واحد)[البخاری،ومسلم،واحمد]
پێشەوا ئیبن حەجەر'رحمه الله' سەبارەت بەم فەرموودەیە فەرموویەتی: (ان اصل دينهم واحد،وهو(التوحيد) وان اختلف فرع الشرائع)[فتح الباري]

واتە: بنچینەی دینی هەموویان پێغەمبەران( عليهم الصلاة والسلام) یەکە ئەویش (التوحيد) بەتەنها(الله) پەرستنیە، ئەگەر چی جیاوازیان هەیە لە شێوازی پەرستش وهەڵس وکەوتی ڕۆژانەیان. بەڵام بنچینەی دینی هەموویان (التوحيد) ە ئەمە بێ جیاوازی..

هەر لەبەر گرنگی (التوحید) تەنها (الله ) پەرستیە کەوا یاسای شەرعی لە بیرو باوەڕو پەرستشدا وەرنە گرتن و کارپێنەکردنێتی هەتا بەڵگەی لەسەر دێتەوە، بەڵام یاسای شەرعی لەشتەکانی تردا لەدنیادا بریتیە لەرێ پێدران وحەڵاڵ بوون مادام بەڵگە نەبێت لەسەر حەرامی) (هذه قاعدة مهمة وجليلة في (اصول الفقه) كما يقولون (الاصل في العبادة المنع إلاّ بالنص، والأصل في الأشياء الإباحة إلاّ بالنص). هەروەکو دەبینین واجب کردنی هەموو فەرزەکان (نوێژ و ڕۆژو جیهاد و حەج و زەکات) حەرامکردنی قەدەغەکراوەکان لەبەر (التوحید) تەنها (الله) پەرستی بوو وە تەواوکەری عەقیدەی (التوحید) بوونە ، هەر وەك دەبینین نوێژ لەبەر خاتری (التوحید) بووە بۆ تەواو کردنی تەنها (الله) پەرستی. هەروەکو الله تعالى دەفەرمووێ: (إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي) (طه؛14)

واتە: بەڕاستی هەر منم تەنها (الله) هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە من، کەواتە هەر من بپەرستن و نوێژەکانیشتان بەچاکی ئەنجام بدەن، تا هەمیشە منتان لە یاد بێت. وەهەروەها دەفەرمووێ: (وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ)(البقره؛43)

واتە: نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن بە دروشمەکانیەوەو زەکاتیش بدەن،لەگەڵ کڕنووش بەراندا کڕنووش ببەن (بۆالله کە پەروەردگارتانە). هەروەها الله تعالى جیهادی واجب کردووە هەر بۆ ئەم مەبەستە بۆ نەهێشتنی دیاردەی شیرك ولەبەر خاتری (التوحید) بۆ تەواو کردنی تەنها (الله) پەرستی؛ هەروەکو الله تعالى دەفەرمووی: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) (الانفال؛39)

واتە: ئیمانداران بجەنگن دژ بەکافرو الله نەناسان تا شیرك و فیتنە و ئاشووب و ئازاردانی موسڵمان نەمێنێت، دین و فەرمانبەرداری هەر هەمووی تەنها بۆ چی بێت؟ بۆ (التوحید) الله پەرەستی بێت، جا ئەگەر بێ باوەڕان کۆڵ بدەن، ئەوە بابزانن بەڕاستی الله بینایە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن. وەهەروەها الله تعالى حەجیش هەر بۆ هەمان مەبەستی (التوحید) واجب کردووە هەروەکو الله دەفەرمووێ: (وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا)(الحج؛27)

واتە: جا بانگی خەڵکی بکە لە ناویاندا بڵاو بکەرەوە با بێن بۆ حەج،

کەواتە ؛ هەمووی بۆ (التوحید) ە هەتا دادوەرترین دادە (اعدل العدل) هەروەکو چۆن هاوەڵ بڕیاردان گەورەترین ستەمە بەبەڵگەی (إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ) (لوقمان; ١٣)

واتە: شیرك هاوەڵ بڕیاردان بۆ(الله) گەورەترین ستەمە کە خاوەنەکەی توشی سزای هەمیشەیی دەکات وبێ بەشی دەکات لەبەزەیی وبەخششی (الله تعالی) هەروەکو الله تعالی دەفەرمووێ: (إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ)( المائدە؛72)

واتە: ئەو کەسەی هاوبەش بۆ (الله) بڕیار بدات، (الله) بەهەشتی لێ حەرام دەکات، وەبۆ هەتا هەتایە لەناو ئاگردا دەمێننەوە، وەلەو ڕۆژەدا هیچ یاریدەدەرو پشتیوانێك نیيە بۆ ستەم کاران.

هەر بۆیەش لەبەر گرنگی وگەورەیی (التوحید)ە کەیەکەم پرسیاری ناو گۆڕ دەربارەی ئەوەیە (الله) ت کێیە؟ وەلەوێوە هەموو شتێك دەست پێدەکات، یان لە ڕۆژی قیامەت کاتی حەشر وحیساب یەکەم پرسیارە کەلە دروست کراوەکانی پەروەردگاری بێ هاوتا دەکرێت، وەهەر لەوێشەوە دەر دەکەوێت کە بارت بەلای کامیان دادەکەوێت. بەهەشت یان دۆزەخ. ئەوە خاڵی یەکەم بوو کەوا باسی گرنگی وگەورەیی (التوحید) بوو الله تعالی بمان گێڕێ لەو کەسانەی کە مافی تەواوی ئەو (التوحید) تەنها(الله) پەرستيیە بدەین وهەست بەو هەموو نازو نیعمەت وبەخششانە بکەین وهەمیشە بیری خۆمان بێنینەوە کە ئێمە بۆچی دروست کراوین وئەو دنیایەش بۆچی خراوەتە ژێر دەستی ئێمە وەبۆ دەبین وبۆ دەژین وبۆ دەمرین؟!.

جماد الاول 1440 کۆچی بەرامبەر بە 2019/1/9 زاینی

## ناوەڕۆك و داخوازیەكانی (التوحيد)

گەورەیی وگرنگی یەی كە (لا إله إلاّ الله) (التوحيد) هەیەتی هیچ كام لەپایەكانی تری ئیسلام وئیمان نییانە، هەر بۆیە زانایانی حەق لەكۆن وتازەدا چەندەها پەرتوكی جۆراوجۆریان لەسەری داناوە وگرنگی یەكی یەكجار زۆریان پێداوە.هیچ شتێك لەوە بەڵگەتبەڵگەتر نییە لەسەر گرنگی(لا إله إلاّ الله) (التوحيد) (بە تەنها یەك الله پەرستی) كە زانایانی سەلەف ناویان ناوە بە (الفقه الأكبر) وە هەر یەك لە پێشەوا شافیعی و ابو حنیفە (رحمهم الله ) پەرتوكیان هەیە بەم ناونیشانە. بۆیە لەسەر هەموو ئیمانداریك پێویستە گرنگی تەواو بە (التوحيد) بدات و ماناو ناوەڕۆك و داخوازیەكانی بزانێت .جونكە هەركەسێك تەنها بەدەم بلێت؛(لا إله إلاّ الله) بەڵام ماناو ناوەڕۆك و داخوازیەكانی نەزانێت . ئەوە سود نابینێت لە تەنها وتنەكەی. و ئیعتیقادی بەو مانا ڕاستەی ئەم وشە پیرۆزە نەبێت، ئەوە تەنها بە گوتنی نابێت بە موسڵمان و، خوێن و ماڵی ناپارێزرێت و ناشچێتە بەهەشت.

**ئەوەی كە خۆی بەئیماندار دەزانێت و دەڵێت؛ (لا إله إلاّ الله) دەبێت چەند مەرجێكی تێدا بێت.**

**یەكەم**؛(العلم بمعناها) ( نفيا وإثباتا).

واتە؛ مەرجە كە زانیاری تەواوی ببێت بە واتای (لا إله إلاّ الله).

**دووەم** ؛(العمل بمقتضاها) (من عبادة الله وحدهُ ظاهراً وباطنا وعدم الإشراك به في شيء) .

واتە؛ كردەوە كردن بەگوێرەی ناوەڕۆك و داخوازیەكانی ئەم وشە پیرۆزە. واتە؛ ئەم وشەیە چ جۆرە ئیعتیقادو قسەو كردەوەیەك پێویست دەكات، بیكەیت و جێبەجێی بكەیت. وە بۆ بەجێگەیاندنی ئەم دوو مەرجەش، پێش هەموو شتێك پێویستە بزانین كە وشەی (لا إله إلاّ الله)، لە دوو بەش پێك دێت، وە هەر بەشەش ماناو پێداویستی و داخوازی تایبەتی خۆی هەیە .

**بەشی یەكەمی**؛ (لا إله)

واتە؛ (لا معبود حق). هیچ پەرستراوێكی حەق نیە؛ بپەرسترێت و هاواری بكرێتێ و پەنای پێ بگیرێت و، داوای بە فریاكەوتن و یارمەتی لێ بكرێت و،

بە گەورە دابنرێت و زەلیلی بۆ بنوێنرێت و، پشتی پێ ببەسترێت و، ماڵی بۆ ببەخشرێت و خۆی بۆ بکرێت بە قوربانی .

کەواتە داخوازیەکەی؛ ئەم بەشە وا پێویست دەکات پەرستن بۆ هیچ شتێك و هیچ کەسێك نەکرێت؛ چونکە (لا إله حقٌ) هیچ پەرستراوێك حەق نییە. کەواتە نابێت ئیعتقادت بە هیـچ یەکێك بێت، وە نابێت پشت بەهیچ یەکێك ببەستیت، وە نابێت خۆشەویستی و بە گەورە دانانت بۆ هیچ یەکێك بێت، وە نابێت زەلیلی بۆ هیچ یەکێك بنوێنیت، وە نابێت ڕەجای چاکەو خێر دەستکەوتن لە هیچ یەکێك بکەیت. وە نابێت دڵت ببەسترێتەوەو هەڵواسرێت بەهیچ پەرستراوێك. وە نابێت هاوار بکەیتە هیچ یەکێك، وە نابێت داوای یارمەتی و فریاکەوتن و پەناگرتن بکەیت لەهیچ یەکێك. وە نابێت کرنووش و پشت چەمانەوەو سەر نەوی کردن بکەیت بۆ هیچ یەکێك، وە نابێت دەست لەسەر دەست دابنێیت و قژ بتاشیت بۆ هیچ یەکێك، وە نابێت ماڵ ببەخشیت و سەربڕین و نەزر بکەیت بۆ هیچ یەکێك وەنابێت ببیە قوربانی وسەربازی هیچ طاغوتێك وە نابێت هیچ یەکێك بە سەرچاوەی بەرنامەو یاسا دانان و فەرمان لێ وەرگرتن و شایستەی گوێڕایەڵی کردنی سەربەخۆ بزانیت.

**دووەم ؛ (إلاّ الله)**

واتە؛ تەنها (الله) پەرستراوی حەقەو، شایستەی ئەوەیە ئیعتیقادمان پێی بێت و، پشتی پێ ببەستین و، هاواری بکەینێ و، بەگەورەی دابنێین و، سەربڕین و نەزری بۆ بکەین، وە گوێڕایەڵی سەربەخۆی بکەین (نطیعه لذاته).لەپێناویدا گیان و ماڵمان ببەخشین . تەنها (الله) شایەنی  پەرستنە وە ناوەڕۆکی ئەم وشە گەورەیە ئەوە دەگرێتە خۆی کە جگە لە (الله) لە تێکڕای پەرستراوەکانی تر بە رستراوی حەق نین و بە تاڵن، چونکە شایەنی پەرستن نین، بۆیە زۆر جار فە رمان کردن بە پەرستنی (الله تعالى) لە گە ڵ نەفی پەرستن لە جگە لە (الله تعالى) پێکە وە دێت، چونکە پەرستنی (الله تعالى) ڕاست و دروست نییە لەگەڵ هاوبەشکردنی جگە لە خۆی لە گەڵیدا لە پەرستندا، الله تعالى دەفەرمووێت؛ ( فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)(البقرە؛ 256) .

واتە ؛ هەر کەسێک بێ باوەڕ بێت و کوفر بکات بە تاغوت، وە باوەڕ بهێنێت بە(الله) ئەوا بە جەخت لەسەرکراوی دەستی گرتووە بە پەتی بە هێزەوە و بچڕان و کردنەوەی بۆ نییە و دەیگەیەنێت بە بەهەشت،

وەهەروەها (الله تعالى) دەفەرموویێت؛ (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ)(النحل؛36)

واتە ؛ بە جە خت لە سە رکراوی بۆ هە موو کۆمە ڵە مرۆڤـــێك کە لە شوێنێکدا ژیابێتن نێردراو' پێغە مبە رێکمان' ناردووە بۆیان کە پێیانی فە رمووە ؛ بە تاك و تە نها (الله) بپەرستن و خۆتان دوور بخەنەوە لە تاغوت

وەهەروەها (الله تعالى) دەفەرموویێت؛( وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا) (النساء؛36)

واتە : بە تاك و تە نها خوای (الله) بپەرستن ، وە هیچ هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن

(لا إله إلاّ الله) دادپەروەری ترین دادپەروەرییە بە ڕەهایی، هەروەکو چۆن هاوبەش بڕیاردان ستەم ترین ستەمە بە ڕەهایی، الله تعالى دەفەرموێت : (إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ) (لقمان؛ 13).

واتە: بە جەخت لە سەر کراوی یەوە هاوبەش بڕیاردان گەورەترین ستەمە.

کەواتە ؛ناوەڕۆك داخوازیەکەی ئەم بەشە وا پێویست دەکات، پەرستن تەنها بۆ (الله) بکەیت؛ بە دڵ و زمان و لاشە و ماڵ. وە لەهیچ جۆرە پەرستنێکدا هیچ یەکێك نەکەیتە شەریکی (الله). نە فریشتە لە(الله) نزیکەکان، وەنە پێغەمبەرە نێرراوەکان، وەنە پیاوچاکەکان، وەنەدارو بەردەکان، وەنە قەبرو مەزرگاکان، وەنە شێخ و مامۆستاکان. بۆیە هەرکەسێك کە بڵێت ؛ (لا إله إلاّ الله) تەواو مانای ڕاستەقینەی نەزانێت، ئەوە بێگومان داخوازیەکەیشی جێ بەجێ نەکردووەو کارکردنیشی ڕاست و پەسەند و پاك و خاڵس نابێت بۆ (الله) ، ئەو کاتە ئیسلامەتیەکەی بەڕاستی دانامەزرێت؛ چونکە یەکەم ڕوکنی ئیسلام بریتییە لە: (لا إله إلاّ الله) (التوحيد) کە ماناو پێداویستیەکەی بریتییە لە (دوورکەوتنەوە لە پەرستنی غەیری(الله) بەهەموو شێوەیەك و، پەرستنی (الله) بە تەنها بەبێ شەریك بۆ دانان)

ابن رجب (رحمه الله) فەرموویەتی ::(جێبەجێ کردنی ئەم مانایە و ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە بەندە دەڵێت: (لا إلة إلاّ الله) وا دەخوازێت و پێویست دەکات کە

هیچ پە رستراوێکی تری نەبێت جگە لە اللە، و (الالە) ئەوەیە کە گوێرایە ڵی دە کرێت و سە رپێچی فەرمانە کانی ناکرێت لە ترس و بە ڕێزی و خۆش ویستن و بە هیوا بوون و پشت بە ستن پێی و داواکردن لێی و پاڕانەوە لەو، کە ئەمانە هیچیان ناگونجێن و دروست نین تەنها بۆ (اللە تعالی) نەبێت .

کاتێك کە پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی اللە علیە وعلی الە وسلم )بە کافرەکانی قورەیشی فەرموو بڵێن؛(لا إلە إلاّ اللە) ئەوانیش لە وەڵامدا گووتیان: (أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَاحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ) (ص؛5)

واتە ؛ ئایا هەموو پەرستراوەکانی کردووە بە یە ك پەرستراو کە (اللە) یە داوای پەرستنی یەك (اللە)مان لێدەکات بەڕاستی ئەمەشتێکی زۆر سەیرو سە رسوڕهێنەرە .

لەم وشەیە تێگەیشتبوون کەوا پەرستنی هەموو بتەکان بە تاڵ دەکاتەوە و پە رستن کورت دەکاتەوە بۆ (التوحید) بە تەنها پەرستنی (اللە تعالی) ،بێ گومان کافرەکانیش ئەم شتە یان نەدەویست بە مەدەرکەوت کە ماناو ناوەڕۆک و داخوازی (لا إلە إلاّ اللە) بریتیە : لە (التوحید) و بەتەنها (اللە) لە پەرستندا، وە وازهێنان لە پەرستنی جگە لە (اللە تعالی)، بۆیە کاتێك کە دەڵێین؛ (لا إلە إلاّ اللە) ئەوا بە تەنها زانین پەرستنی (اللە تعالی) مان بەتەنها ئاشکرا کردووە ،ئەوەمان ئاشکرا کردووە کەوا هیچ پەرستراوێکی تر نیە کە جگە لە (اللە تعالی) بپەرسترێ هاواری بکرێتێ وپشتی پێ ببەسترێ و هیچ فەرمانڕەوایەک نیە جگە لە (اللە تعالی) دەبێ ئەوە بزانین لەگەڵ ئەم ئاشکرا کردنە کەوا یەکەم ڕوکنی ئیسلام بریتییە لە: (لا إلە إلاّ اللە) کە ماناو پێداویستیەکەی بریتییە لە (دوورکەوتنەوە لە پەرستنی غەیری (اللە) بەهەموو شێوەیەك و، پەرستنی (اللە تعالی)ش بە تەنها بەبێ شەریك بۆ دانان). هەروەك لەم فەرموودە صەحیحانەدا بۆمان دەردەکەوێت؛

خەلیفەوپێشەوای ئیمانداران عمری کوڕی الخطاب(رضي اللە عنە) فەرموویەتی؛پێغەمبەری اللە (صلی اللە علیە وعلی الە وسلم) فەرمووی؛ (الإسلام : أن تشهدَ أن لا إلە إلاّ اللە وأن محمدا رسول اللە، وتقیم الصلاةَ، وتوتي الزکاة، وتصوم رمضان، وتحج البیت إنِ استطعت إلیە سبیلا)[صحیح مسلم] .

